بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه وبعد:

به پشتیوانی الله تعالی ئه‌م باسه ده‌نووسم له ڕونكردنه‌وه‌ی گومڕایی خه‌وارجه تازه په‌یدابووه‌كانی كوردستان دا به ئومێدی ئه‌وه‌ی الله تعالی ئه‌م باسه بكاته هۆكاری ئاگاداركردنه‌وه‌ی برایان و خوشكانی ڕێگه‌ی پیرۆزی ته‌وحید و جیهاد و گومڕایی و سه‌رلێشێواوی ئه‌وخه‌واریجانه‌یان زیاتر بۆ ده‌ركه‌وێت و وه‌كو كه‌سانی گومڕا و مبتدع بڕوانن بۆیان وخۆیانیان دورلێبگرن , وه‌بیكاته هۆكاری ڕێنمویی وهیدایه‌تی خه‌واریجه‌كان و ته‌وبه‌بكه‌ن و ده‌ست له ته‌كفیر كردنی به‌ناحه‌ق موسڵمانان هه‌ڵگرن.

له ئه‌م سه‌رده‌م و ڕۆژانه‌دا حاڵی ئێمه و ئه‌هلی سونه‌ت و جه‌ماعه‌ت به‌و شێوه‌یه‌یه كه الشاطبي له كتێبي الاعتصام له پێشه‌كیه‌كه‌یدا ده‌ڵێت: ( فكنت على حالة تشبه حالة الامام الشهير عبدالرحمن بن بطة الحافظ مع أهل زمانه,إذ حكى عن نفسه مقال عجبت من حالي في سفري و حضري مع الاقربين مني ولأبعدين,والعارفين والمنكرين فإني وجدت بمكة وخراسان و غيرهما من الاماكن اكثر من لقيت بها-موافقا و مخالفا-دعاني على متابعته على مايقوله , و تصديق قوله والشهادة له ذلك كما يفعله اهل الزمان,سماني موافقا,وإن وقفت في حرف من قوله او في شيء من فعله سماني مخالفا ,وإن ذكرت فيواحد منهما أن الكتاب والسنة بخلاف ذلك وارد, سماني خارجياً , وإن قريء عليَّ حديث في توحيد , سماني مشبهاً , وإن كان في الرواية سماني سالمياً وإن كان في الإيمان سماني مرجئاً وإن كان في فضائل ابي بكر و عمر سماني ناصبيا وإن كان في فضائل أهل البيت سماني رافضيا ) الاعتصام ص 19

واته: من له حاڵێكدا بوم له حاڵی ئیماي به‌ناو بانگ عبدالرحمن بن بطة ی حافظ ده چو له گه‌ڵ ئه‌هلی زه‌مانی خۆیدا,كاتێك له باری حالی خۆیه‌وه وتی: سه‌ر سوڕما له حالی خۆم له حه‌ضه‌رما له‌جێگه‌ی خۆم , له‌گه‌ڵ نزیكه‌كانم و له‌وانه‌ی كه لێم دورن ,له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی كه ده‌مناسن و ئه‌وانه‌ی كه‌نامناسن , به‌ڕاستی من له مككه و خوراسان و جگه له‌و دوو شوێنه‌ش دا له جێگاكان زۆربه‌ی ئه‌وانه‌ی كه‌پێیان گه‌یشتم-ئه‌وانه‌ی كه موافق و هاوڕابوون و ئه‌وانه‌ش كه مخالف و جیاوازبوون- بانگی ده‌كردم بۆ شوێن كه‌وتنی له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ده‌یوت, وه بۆ به‌ڕاست دانان و ته‌صدیقی ئه‌وه‌ی كه ده‌ڵێت , وه شایه‌تی بۆ بده‌م , جا ئه‌گه‌ر من تصدیقی ئه‌وه‌م كرد كه ده‌یڵێت و ڕێگه‌م پێ دا وه‌كو چۆن ئه‌وه‌ی كه ده‌یكه‌ن ئه‌هلی ئه‌م زه‌مانه , ئه‌وه ئه‌وكه‌سه ناوی لێنام موافق و هاوڕا , وه ئه‌گه‌ر من وه‌ستام له‌سه‌ر یه‌ك پیت و حه‌رف له وه‌ی كه دیلێت یان له شتێك له‌وه‌ی كه ده‌یكرد ناوی لێده‌نام مخالف و جیاواز.

وەئەگەر لەبارەی وتەو کردەوەیەوە لەبارەی یەکێکیانەوە بموتایە و یادم بکردایە کە بەڕاستی کتاب و سننەت بە خیلاف و پێچەوانەی ئەوەی ئەو هاتوە, ناوی دەنام خارجي, وەئەگەر حەدیث و فەرمودەیەکم بۆ بخوێندرایەتەوە لە بارەی تەوحیدەوە, ناوی دەنام مشبهە وە ئەگەر لە ڕیوایەتا بوایە ناوی دەنام سلمي, وە ئەگەر لە بارەی ئیمانەوە بوایە ناوی دەنام مورجئە, وە ئەگەر لە بارەی فەضائلی ئیمای ابوبکر و ئیمانی عومەرەوە بوایە (الله تعالی لێیان ڕازی بێت) پێ ی دەوتم ڕافضي. بەڵێ سالآنێکە ئەهلی گومڕایی جەهم و ئیرجاء بەناحەق و ناڕەوا پێمان دەڵێن خەوارج و ئەهلی غلو, لە بەرامبەریشدا خەواریجە جاهیلە تازە پەیدابوەکان پێمان دەڵێن جەهمی و بەناحەق تەکفیرمان دەکەن.

بێگومان ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە هەموو جێگەو سەردەمێکدا حاڵیان وابوە و لە لایەن ئەهلی ئیفراط و تەفریطەوە ئەو تۆمەتانەیان بەناحەق لێدراوە .

ئەم باسەی کە لە ئاشکراکردنی گومڕایی خەواریجەکان دەینووسم بإذن الله بە جێبەجێ کردنی سوننەتی خەلیفەی ڕاشد علی کوڕی ئەبی طالب (الله تعالی لێی ڕازیبێت)کەوا عبدولآی کوڕی عەباسی(الله تعالی لەخۆی و باوکی ڕأزی بێت)ڕەوانە کرد بۆ لای خەواریجەکان بۆ ئەوەی ئامۆژگاریان بکات و بانگیان بکات بۆ تەوبە و وازهێنان لە گومڕایی یە کەیان و گەڕانەوە بۆ ڕێگەی حەق و ڕاستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت, کە الحمدلله دوای ئەوەی کە حەق بۆ ڕونکردنەوە هەزاران خەوارج تەوبەیان کرد و وازیان لە گومڕایی هێنا و گەڕانەوە بۆ ڕێگەی حەق.

لەم نووسراوەدا بە پشتیوانی الله تعالی باسی حوکمی خەڵکی دەکەم لە دارەکان دا واتە لە دارالإسلام و لە دارالکفردا وپاشان ڕەدی خەواریجەکان دەدەمەوە کە لەم باسەدا تەکفیری بەناحەق دەکەن بەبێ بەڵگە.

## سەرەتا بە پێناسەی دارەکان،دارالإسلام و دارالکفر دەست پێدەکەم

1-**دار الإسلام**: بریتی یە لەو جێگایەی حوکم حوکمی ئیسلامە و توانا و هێز و دەسەڵات بەدەستی موسڵمانانە و تەنها ئاڵای پیرۆزی تەوحیدی تێدا بەرزو شەکاوەیە.

ئیمامی إبن القیم رحمە الله دەفەرموێت:جمهور دەڵێن (واتە جمهوری علما) ((دار الإسلام ئەو جێگەیەیە کە موسڵمانان لەوێ دابەزیون و حوکمی ئیسلام تێدا جێ بە جێ دەکرێت,وە ئەگەر حوکمی ئیسلامی تێدا نەکرێت نابێت بە دار الاسلام)) کتاب احکام اهل الذمة ج1ص366

كەواتە هەر جێگەیەك حوكمی ئیسلامی تێدا كرا و بەدەست موسڵمانانەوە بوو ئەوە ئەو جێگەیە دار الاسلامە , هەرچەند خەڵك و دانیشتوانی ئەو جێگەیە موسڵمان نەبن و كافریش بن , وەكو خەیبەر لە سەردەمی رسول الله دا "صلى الله عليه وسلم" فتح كرا و بوبە دار الإسلام و خەڵك و دانیشتوانەكەی جولەكە بوون.

السرخسی لە كتابي ((تاسيرالكبير))دا دەڵێت: (( و الدار تصير دار المسلمين بإجراء احكام الإسلام )) 5\2197

واتە (( وە دار دەبێتە داری موسڵمانان – واتە دارالإسلام- بە جێ بە جێ كردنی حوكمەكانی ئیسلام تیایدا)).

2- **دار الكفر** : بریتی یە لەو جێگەو شوێنەی كە حوكمی كوفری تێدا دەكرێت –واتە حوكمی غەیری قورئان- و توانا و هێز و دەسەڵات لەوێدا بۆ كافرانە.

ابو يعلى الحنبلي لە كتابی (( المعتمد في اصول الدين)) لە لاپەڕە 276 دا دەڵێت: ((كل الدار كانت الغلبة فيها الأحكام الكفر دون احكام الإسلام في دار الكفر)).

واتە: هەموو دارێك كە زۆر و هێز لەوێدا بۆ ئەحكامی كوفربێت بێجگە لە ئەحكامی ئیسلام ئەوە ئەو دارە داری كوفرە.

كەواتە هەر جێگەیەك حوكم تیایدا حوكمی كوفر بوو ئەوە ئەو جێگەیە داركفرە, هەرچەند ئەگەر ئەوانەی لەوێ دەژین زۆربەیان موسڵمان بن.

## دار الكفر دوو جۆرە

1-**دار الكفر الأصلي:** داری كوفری ئەصلی بریتی یە لەو جێگا و شوێنانەی كە هیچ كاتێك پێشتر دار الإسلام نەبوە, وەكو ئەمریكا ویابان و كەنەدا.

2-**دار الكفر الطاريء**: داری كوفری طاريء بریتی یە لەو جێگە و شوێنانەی كە پێشتر دار الاسلام بووە و پاشان لە لایەن كافران یان مورتەدانەوە داگیر كراون و بوونە دار الكفر وەكو ئەندەلوس ((اسپانیا)) و فەلەستین و میسر و جەزیرەی عەرەبی و كوردستان.

*دوای ئەوەی پێناسە وباسی جۆری دارەكانمان كرد,پاشان باسی حوكمی خەڵكی دەكەین لەو دارانەدا,بەڵام پێش ئەوەی دەست بە نووسینی ئەو باسە بكەین پێناسەی مستور الحال و مجهول الحال دەكەین

## مستور الحال و مجهول الحال

1-**مستور الحال:** بريتى يە لەو كەسە موسڵمانەى كە نيشانەيەك يان زياترى لە نيشانەكانى موسڵمانێتى لە خۆيدا دەرخستوە و ئيتر هيچى تر لە حاڵى نازاندرێ , بەڵام هيچ جۆرە شركێكى گەورە و كوفرى گەورەى ديارى لێ نەبيندراوە .

2-**مجهول الحال**: بريتى يە لە ئەو كەسەى كە نەهيچ نيشانەيەكى ئيسلامەتى لێ بينراوە نەهيچ شرك و كوفرێكى گەورەى لێوە دەركەوتوە

**الإسلام**: تەوحيدە يان شەريعەتى پێغەمبەرمانە "صلى الله عليه وسلم". المعجم كلمات القرآن

الله تعالى ئەفەرمێت: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ سورة آل عمران الاية 85.

واتە: هەركەسێك جگە لەئيسلام بكات بەئايين و ڕێبازى ژيان ئەوە لێى قبول ناكرێ و لەرۆژى دواييدا لەخەسارەت مەندانە .

## ئيمامى ابن القيم دەفەرموێت: ئيسلامەتى بە شێوەيەكى گشتى دەبێتە دووبەشەوە

1-**ئيسلامەتى حەقيقى يان موسڵمانى حەقيقى:** بريتى يە لە ئەو موسڵمانەى كە بەدڵ و زمان و ئەندامەكانى لاشەى موسڵمانە و شەرت و مەرجەكانى وشەى پيرۆزى لا إله إلا الله ى لەخۆيدا هێناوەتەدى و موەحيدە و پەرستنەكان تەنها بۆ الله تعالى ئەنجام دەدات و تەكفيرى هەركەس دەكات كە پەرستنبۆ الله تعالى ئەنجام نەدات و بەهيچ جۆرێك شركى گەورە و كوفرى گەورەى ديار ئەنجام نادات و دور و بەريە لە شرك و موشركين و تەكفيريان دەكات. هەركەس بەم شێوەيە بێت ئەوە ئەو كەسە لە باطن وظاهر دا موسڵمانە.

2-**ئيسلامى حكمى يان موسڵمانى حكمى**: بريتى يە لە ئەم موسڵمانەى نيشانە و تايبەتمەنديەكى ئيسلامەتى لە وتە يان كردەوەى دا دەرخستوە و هيچ شركێكى گەورە و كوفرێكى گەورەى ديارى لێ دەرنەكەوتوە, نەلە وتەكانيدا و وە نەلە كردەوەكانى دا هەركەس بەم شێوەيە بێت حكماً موسڵمانە وپێ ى دەوترێت موسڵمانى حكمى , واتە ظاهراً موسڵمانە و هەڵسوكەوتى موسڵمانى لەگەڵدا دەكرێت و نهێنى و حەقيقەتى دڵ و حاڵى تەنها الله تعالى دەيزانێت.

## نيشانە و علامەتەكانى ئيسلامى حوكمى

الله تعالى كۆمەڵێك نيشانە و تايبەتمەندى داناوە بۆ حوكمدان بە ئيسلامەتى هەركەسێك و جياكردنەوەى لە كافران واتە هەريەك لەو نيشانە تايبەتمەنديانە بەڵگەن بۆ حوكمدان بە موسڵمانێتى هەركەسێك كە دەرى خستبێت لە خۆيدا, بەو مەرجەى هيچ شركێكى گەورە و هيچ كوفرێكى گەورەى ديارو ئاشكراى لێ نەبينرابێت.

1-**هێنانى شايەتمان**: هەركەس شايەتمان بهێنێ ئەگەر كافرى ئەصلى بێت موسڵمان دەبێت حوكمى موسڵمانێتى دەدرێت بەسەرى دا, وە ئەگەر مورتەدێكيش بيەوێت موسڵمان ببێتەوە و شايەتمان بهێنێت, حوكمى ئيسلامەتى دەدرێت بەسەريدا ئەگەرهيچ شركێكى گەورە و هيچ كوفرێكى گەورەى ديارى نەبێت, كەواتە شايەتمان نيشانە و تايبەتمەندى ئيسلامەتييە.

رسول الله "صلى الله عليه وسلم" دەفەرموێت : (( أمرت أن اقاتل الناس حتى يقولوا أن لا اله الا الله فإذا قالوها عصموا مني دماءهم و اموالهم إلا بحقها و حسابهم على الله عزوجل)) متفق عليه

واتە: فەرمانم پێكراوە كە كوشتارى خەڵك بكەم تاوەكو دەڵێن لا اله الا الله, ئەگەر وتيان ئەوە خوێن وماڵيان لەمن حەرام دەبێت مەگەر بەحەقى لا اله الا الله و حسابيان لەسەر الله تعالى يە.

2-**نوێژ كردن**: نيشانە و تايبەتمەندى ئاينى پيرۆزى ئيسلامە هەر كەسێك نوێژى كرد هيچ شركێكى گەورە وهيچ كوفرێكى گەورەى ديارى لێ نەبينرا ئەوە حوكمى ئيسلامى ئەدرێ بەسەريدا – ئيسلامى حوكمى – وبە موسڵمان دەژمێردرێت .

رسول الله "صلى الله عليه وسلم" دەفەرموێت: (( من صلى صلاتنا و استقبل قبلتنا و اكل ذبيحتنا فذلك مسلم)) رواه البخاري

واتە: ((هەر كەس ئەو نوێژە بكات كە ئێمە دەيكەين و ڕوبكاتە ئەو قيبلەيەى كە ئێمە ڕوى تێدەكەين و وە سەربڕاوى دەستمان بخوات ئەوە ئەو موسڵمانە )).

3-**بانگ دان**: بانگدان لەبەر ئەوەى وشەى پيرۆزى شايەتمانى تێدايە و هەركەسێكيش كافر بێت و شايەتمان بهێنێت بە شايەتمان هێنانەكەى حوكمى ئيسلامەتى دەدرێت بەسەريدا, كەواتە هەركەسێك بانگى دا و هيچ

شرکێکی گەورە یان هیچ کوفرێکی گەورەی دیاری لێ نەبینرا ئەوە ئەو کەسە حکما موسڵمانە و مامەڵە و هەڵسوکەوتی موسڵمانی لەگەڵدا دەکرێت.

4-**کە سێك بڵێت من موسڵمانم:** بەبەڵگەی ئەو فەرمودەیەی ئیمامی موسلم رحمە اللە ڕیوایەتی کردوە, لە عمرانی کوڕی حصینة وە فەرموی:عەشیرەتی ثەقیف هاوپەیمانی بنی عقیل بوون, ثەقیف دووپیاویان لە هاوەڵانی رسول اللە (صلی اللە علیە وسلم) ئەسیر کرد, لەبەرامبەردا هاوەڵانی رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" پیاوێکیان لە (بنی عقیل) ئەسیرکرد, وە وشترێکی ( عضباء) یان لەگەڵدا گرت. رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" تەشریفی هێنا بۆ لای و ئەو ئەسیرە، بەسترابووەوە ئەسیرەکە وتی ئەی محمد, رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" هات بۆ لای و فەرمووی: بەچی هۆکارێك منت گرتوە ؟ وە بەچی هۆکارێك ئەو وشترەتان گرتوە ؟ رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" فەرموی: بەتاوانی هاوپەیمانەکانت (ثقیف کە دوو هاوەڵیان ئەسیر کردبوو) پاشان رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" ڕۆیشت, ئەسیرەکە بانگی رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" کرد وتی: ئەی محمد ئەی محمد، رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" بە رەحم ونەرم بو گەڕایەوە بۆلای و فەرموی: کارت چییە چیت دەوێت, ئەسیرەکە وتی: من موسڵمانم, رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" فەرموی: ئەگەر بتوتایە موسڵمانم لە کاتێکدا خاوەنی کاری خۆت بویت – واتە پێش ئەسیر بونت – ئەوە ڕزگار و سەرفراز دەبویت بەتەواوی ڕزگاری و سەرفرازی, پاشان ڕسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" ڕۆیشت, ئەسیرەکە وتی ئەی محمد ئەی محمد، رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" هات بۆلای و فەرموی: چیت دەوێت و کارت چیە؟ ئەسیرەکە وتی بەڕاستی برسیمە خواردنم پێ بدە وە تێنومە ئاوم پێ بدە, رسول اللە "صلی اللە علیە وسلم" فەرموی: ئەمە پێویستی تۆن – واتە پێویستی تۆیە و ئاو وخواردنت پێ دەدەین – ئەو ئەسیرە گۆڕدرایەوە بە دوو هاوەڵە ئەسیرەکە .صحیح مسلم 1641

**محی الدین ی النووي رحمە اللە لە شەرحی صەحیحی ئیمامی موسلم دا لە شەرحی ئەم حەدیثە دا دەڵێت:** وتەکەی پێغەمبەر "صلی اللە علیە وسلم" بە ئەسیرەکە, کاتێ ئەسیرەکە وتی: من موسڵمانم ئەگەر بتوتایە موسڵمانم لە کاتێکدا خۆت خاوەنی کاری خۆت بویت – واتاکەی ئەوەیە ئەگەر وشەی ئسلامت بوتایە پێش ئەسیر بونت لەکاتێکدا تۆ خۆت خاوەنی خۆت بویت, ڕزگار و سەرفراز دەبویت بەهەموو رزگاری و سەرفرازیيەك, چونکە جائز نەبو ئەسیر بکرێت ئەگەر تۆ پێش ئەسیر بونەکەت موسڵمان ببویتایە. شرح صحیح مسلم ج11 ص 97

کەواتە هەرکەسێ پێش ئەسیر بونی بڵێت من موسڵمانم هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی شرکی گەورە و کوفری گەورەی دیاری لێ نەبینرا ئەوە ئەو کەسە بەبەڵگەی ئەم فەرمودە پیرۆزە حوکمی موسڵمانی هەیە وحکما موسڵمانە.

5-**ئەگەر کەسێك موسڵمانێك یان زیاتر شاهیدی بۆ بدەن کە موسڵمانە**: بە بەڵگەی ئەو فەرمودەیەی خۆشەویستمان فەرموی لە بارەی ئەسیرەکانی جەنگی بەدرەوە: هیچ کەس لەئێوە هەڵناگەڕێتەوە تەنها بە پێدانی فیدیە نەبێت یان بەڵێدانی گەردنی – واتە ئێوە لە نێوانی دوو خیاردان, یان فیدیە دەدەن یان دەکوژرێن بە لێدانی گەردنتان – عبدالله ی کوڕی مسعود فەرموی وتم تەنها سهل ی کوڕی بیضاء نەبێت, بەڕاستی ئەو ناکوژرێت چونکە بەڕاستی من ئەمبیست لێی ئیسلامی دەوێت, رسول الله "صلى الله عليه وسلم" فەرموی: تەنها سهل ی کوڕی بیضاء نەبێت .البداية والنهاية ابن كثير ج3 ص 298

**لە کتابی سیرەی ابن هاشم دا هاتوە:** ابن اسحاق وتی ئەیوبی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عبدالله ی کوڕی ابي صعصعة کە لە بنی عدی کوڕی نجار بوو, بۆی گێڕامەوە سلمی ی کچی قیس((ام المنذر)) ی خوشکی سليط ی کوڕی خوشکی سليط ی کوڕی قيس –کە ئەو یەکێك بوە لە پورەکانی رسول الله "صلى الله عليه وسلم" و و لەو صحابیانە بوو کە ڕووەو هەردوو قیبلە کە نوێژی کردبوو –واتە نوێژی کردوە ڕووەو مزگەوتی اقصا پێش فەرض بوونی نوێژکردن ڕووەو کەعبەی پیرۆز, وە بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" بەیعەتی ژنان, داوای کرد لە ڕەسول الله "صلى الله عليه وسلم" (( لە ناو ئەسیرەکانی بەنی قريضة )) دا رفاعة ی کوڕی سەموال ی قورەضی پێبدات, واتە نەکوژرێت. وە ئەو – رفاعة- بالغ ببوو و پەنای بردبوو بۆ ئەو ژنە صەحابیە بەرێزە, وە رفاعة ئەوانی پێشتر دەناس , ئەو ژنە صحابیە وتی: ئەی پێغەمبەری الله, باوك و دایكم فدات بێت رفاعة م پێببەخشە, چونکە ئەو براستی دەڵێت کە نوێژ دەکات و گۆشتی وشتر دەخوات, وتی رسول الله "صلى الله عليه وسلم" پێ ی بەخشی, ئەو ژنە صحابیە بەرێزە بۆ هۆی نەکوژرانی )) سيرة ابن هيشام ج2 ص152

کە دەڵێت گۆشتی و وشتر دەخوات, چونکە جولەکە لەعنەتی الله تعالى یان لێبێت گۆشتی وشتر ناخۆن لەگەڵ نوێژکردنەکەیدا ئەویش بەڵگەکە رفاعة جولەکە ني يە و موسڵمانە.

کەواتە هەرکەسێك موسڵمانێك شاهیدی موسڵمانێتی بۆ بدات و هیچ شیرك و کوفری گەورەی لێ نەبینرا ئەوە ئەو کەسە حکماً موسڵمانە و مامەڵەو هەڵسوکەوتی موسأمانی لەگەڵ دەکرێت.

6- **حەج کردن:** یەکێکە لە نیشانە و تایبەتمەندیەکانی موسڵمانان و ئەگەر کەسێکمان دی چو بۆ حەج کردن سەردانی کردنی ماڵی الله تعالى و هیچ شرك و کوفرێکی گەورەمان لێنەبینی ئەوە حوکمی موسڵمانی هەیە لەلامان.

7- **موسڵمان بوونی باوك و دایكی منداڵ یان موسڵمان بوونی یەکێکیان نیشانەیە بۆ موسڵمانی ئەو منداڵەی کە نەگەیشتبێتە قۆناغی باڵغ بوون.**

بێجگە لەم نیشانانە هەندێك قەرینەی تر هەن كە بەڵگەو نیشانەی سەربەخۆ و تەواونین بۆ حوكم دان بە موسڵمان دانانی هەركەسێك كە ئەو تەنها ئەو قەرینانەی لێبینرابێت بەبێ ئەوەی هیچ یەكێك لە نیشانەكانی لێ بینرابێت.

ئەو قەرینانەش وەكو پۆشینی جل و بەرگێك كە ئەو جل و بەرگە موسڵمانان دەیپۆشن و تایبەتە بەئەوان یان بونی ڕیش و كورتكرنەوەی سمێڵ و پۆشینی جل و بەرگی كورت بۆ پیاوان و پۆشینی حجاب و عەبا و نیقاب بۆ ئافرەتان,

ئەم قەرینانە نابنە بەڵگە و نیشانەی سەربەخۆ بۆ حوكم دانی بەموسڵمانی خاوەنەكانیان بەلام هۆكارن بۆ تبین كردن لە حاڵیان ئەگەر بینران لە كاتی حوكم دان لەسەریاندا لە دار الكوفردا.

## حوكمی مستور الحال

وەك لە لاپەڕەكانی پێشودا پێناسەی مستور الحال مان كرد و وتمان بریتی یە لەو كەسەی كە نیشانەیەك یان زیاتری لە نیشانە و تایبەتمەندیەكانی ئیسلامی لێ دەركەوتوە و بێجگە لەو نیشانەیە هیچی تری لەبارەیەوە نازاندرێ وە هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی شركی گەورە و جۆرەكانی كوفری گەورەی دیاری لێنەبینراوە, واتە هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەكی ئیسلامەتی لێ دەرنەكەوتوە, حوكمی شەرعی ئەو كەسە لە دار الاسلام و لە دارالكفردا بەهەردوو جۆرەكەی دار الكوفری اصلی و طارىء وە ئیسلام و موسڵمان بونە, ئەو كەسە حوكماً موسڵمانە و ئەرك و واجبە مامەڵە و هەڵسوكەوتی موسڵمانانی لەگەڵدا بكرێت تاكو كوفر و شركی گەورەی لێ دەردەكەوێت.

## ((حوكمی شەرعی مجهول الحال))

وەكو لە سەرەتاوە پێناسەی مجهول الحالمان كرد و وتمان بریتی یە لە ئەو كەسەی كە هیچ نیشانە و تایبەتمەندیەكی ئیسلامەتی و هیچ شرك و كوفرێكی گەورەو هەڵوەشێنەرەوەیەكی ئیسلامەتی لێ دەرنەكەوتوە.

## حوكمی شەرعی ئەوكەسە بەپێ ی جیاوازی دارەكان دەگۆڕێت

1-**حوكمی مجهول الحال لە دار الإسلامدا:** حوكمی مجهول الحال لە دارالإسلام دا ئیسلام و موسڵمان بوونە و واتە ئەگەر هەركەسێكی مجهول الحالمان دی لە دار الإسلام دا بە موسڵمانی دەزانین لەبەر ئەوەی وەك لە پێناسەی دارالإسلامدا لەسەرەتادا وتمان دارالإسلام ئەو جێگەیەیە كە حوكم تێیدا حوكمی ئیسلامە و توانا و هێز و دەسەڵات بۆ موسڵمانانە و لەوێ دا تەنها موسڵمانان و ئەهلی كیتاب دەژین كەواتە لە دارالإسلام دا تەنها

موسڵمان وجولەکەو گاور و مجوسی دەبینین, ئەو جولەکە و گاور و مەجوسیانەی جزیە و سەرانە دەدەن, وە ئەرك و كاری ئەمیری ئیمانداراانەکە ئەهلی جزیە والێ بکات کە جل و بەرگی تایبەت بەخۆیان بپۆشن بۆ ئەوەی لەگەڵ موسڵمانان لێکچون لە نێوانیاندا نەبێت و هەموو کەس بەهۆی جیاوازی جل وبەرگی ئەوانەوە بزانێت کێ موسڵمانە و کێ کافرە .

ئیمامی ابن القیم لە کیتابی اعلام الموقعین لە لاپەڕە 109 بۆ 110 دەفەرموێ الوجه الاربعون: [ ان الشروط المضروبة على اهل الذمة تضمنت تميزهم على المسلمين في الباس و الشعر و المراكب و غيرها لئلا تفضي مشابهتهم الى أن يعامل الكفار معاملة المسلم, فسدت هذه الذريعة بإلزامهم التميز عن المسلمين ].

واتە: ڕوو و شێوەی چلەم: بەڕاستی ئەو مەرج و شروتە دانراوانەی سەر ئەهلی ذیمە ئەوەی تێیدایە کە دەبێت جیاواز ین و جیابکرێنەوە لە موسڵمانان لە جل و بەرگ و قژ و سواریەکان و غیری ئەمانەش, ئەمە بۆ ئەوەی لێکچونیان بە موسڵمان نەبێتە هۆی مامەڵە و هەڵسوکەوت لەگەڵ کافردا نەکرێت بە ئەو شێوەیەی کە لەگەڵ موسڵماندا دەکرێت, ئەم ڕێگەی تێکەڵ بونە بەستراوە بەوەی کە ئەهلی ذمة ئیجبار دەکرێن لەسەر جیاکردنەوەی خۆیان لە موسڵمانان.

کەواتە لە دارالإسلام دا ئەهلی کتاب و مەجوسی کە ئەهلی ذمە ن ئەگەر هەبن بەهۆی جیاوازی جل و بەگ و نیشانەی ترەوە لە موسڵمانانیان جیادەکەینە, ئەی چۆن بزانین ئەو خەڵکەی تر غیری ئەهلی کتاب ئەگەر مجهول الحال بون موسڵمانن،

بە بەڵگەی ئەوەی کە دەڵێن دار الإسلام واتە حوکمی بە قورئان و سوننەت تێدا دەکرێت کەواتە لە دارالإسلام دا کەس ناتوانێ بە ئاشکرا بە مورتەدی بژی و بونی هەبێت لەبەر ئەوەی رسول الله "صلى الله عليه وسلم" دەفەرموێت : (( من بدل دينه فاقتلوه )) رواه البخاري , واتە : هەرکەس دینەکەی گۆڕی (( مورتەد بویەوە )) بیکوژن .

کەواتە ئەرك وکاری ئەمیری ئیماندارانە کە نەهێڵێت هیچ کەس بەئاشکرا بەمورتەدی لە دار الإسلام دا بونی هەبێت و ئەگەر هەرکەسێك مورتەد بووەوە دەبێت استتابەی بکات و ئەگەر موسڵمان نەبووەوە بیکوژێت.

کەواتە ئێمە بە عیلم و ئاگاداریەوە دەزانین کە مجهول الحال لە دار الإسلامدا موسڵمانە .

# حوكمی مجهول الحال له داركفردا

1-**له دار الكفری اصلی دا** : حوكمی مجهول الحال له دارالكفر دا كوفر و كافر بوونه, له لەبەر ئەوەی ئەصلی دا به پێ ی ریساو قاعیدەی الاستصحاب كوفره, واته هەركەسێكمان له دارالكفری ئەصلی بینی و ئەو كەسە هیچ نیشانەیەكی ئیسلامەتی و هیچ شرك و كوفرێكی گەورەی لێ نەبینرا, ئەوە ئەو كەسە حوكمی كافر بوونە, بەپێی ڕێسا و قاعیدەی (( الاستصحاب )) وه ئەم باسە و بەم شێوەیەی باسمان كرد له كتێبه فقهی یەكانی هەرچوار مەذهەبه دیار و مشهورەكەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دا هاتوه له باب و بابەتەكانی ((اللقیط )) وه بابی جیهاد و تێكۆشان و باسی كوشتاری كافران له دار الكفری ئەصلی دا.

2-**دار الكفری طاريء**: حوكمی كەسی مجهول الحال له دارالكفری طاريء دا وه ستان و (( توقف)) ه , واته ئەو كەسەی له دارالكفری طاريء دا هیچ نیشانه و عەلامەتێكی ئیسلامەتی هیچ شرك و كوفرێكی گەورەی لێ نەبینرا ئەوە لەگەڵ ئەوەدا گومانمان نی یه كه ئەوكەسە له واقیعدا یان موسڵمانە و یان كافره بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە هیچ نیشانەو عەلامەتوبەڵگەیەكمان نی یه لەسەر موسڵمان بوون و كافر بوونی و نازانین و زانست و علمان نی یه له حاڵی ئەو كەسە له حوكمدان لەسەری دەوەستین و هیچ حوكمێكی موسڵمان بوون یان كافر بوون نادەین لەسەر ئەو كەسە تاكو به بەڵگە بۆمان دەردەكەوێت كه ئەو كەسە موسڵمانە یان كافره ئەو حوكمە بۆ هەموو مجهول الحال ێكه تەنها كەسێك مردبێت و مجهول الحال بێت و دوای هەوڵ دان و پرس كردن له بارەیەوە هیچ بەڵگەیەكی شەرعیمان دەست نەكەوێت لەسەری كه موسڵمان بووە یان كافر, وه بۆ منداڵێكی دۆزراوە له دارالكفری طارء دا كه نەتوانێ قسەبكات لەبەر منداڵی و یان كەسێكی شێت, ئەم سێ كەسە ئەگەر مجهول الحال بوون حوكمی شەرعیان بەپێ ی حوكمی ئەو داریە كه تیایدا دەژین لەگەڵ لێكدانەوە و ڕەچاوكردنی زۆرینەی خەڵكی ئەو داره كه موسڵمانن یان كافر,

بەڵگە شەرعیەكان زۆرن لەسەر ئەوەی كه حوكمی كەسی مەجهول الحال له دارالكفری طاريء دا وەستان و (( توقف )) ه تا حاڵی ئەو مجهول حالەمان بۆدەردەكەوێت كه موسڵمانە یان كافره.

ئیمامی ابن العز الحنفي رحمه الله له شەرحی عقیدەی طحاوی دا لەسەر ئەوه كه ئەگەر كەسێك شرك یان كوفر یان نفاقی لێدەرنەكەوتبوو نابێت حوكمی مشرك بونی یان كافر بوونی یان مونافق بوونی بدرێت ئەم ئایەتە قوڕئانییه پیرۆزه بەبەڵگە دەهێنێتەوه كه الله تعالى دەفەرموێت: ( ولا تقف ماليس لك به علم إن السمع والبصر و الفؤاد كل اولئك كان عنه مسؤلا )) الاسراء .شرح عقيدة الطحاوية 339

واته: لەسەر شتێك مەوەستە كە علمت نی یە لەسەری بەڕاستی گوێچكە و چاو  و دڵ هەموو ئەوانە لە بارەیەوە بەر پرسن.

بەڵێ ئێمە لە دارالكفری طارىء دا واتە ئەو دارەی كە پێشتر دار الاسلام بووە و پاشان داگیر كراوە و كراوە بە دارالكفر و خەڵكی لەوێدا كۆمەڵێكیان كافر بونەتەوە و كۆمەڵێكیان بەموسڵمانی ماونەتەوە - هەرچەند ڕێژەی موسڵمانی كەمتر بێت- ئەو كەسەی حاڵی نادیارە و هیچ علامەت و نیشانەیەكی ئیسلامەتی و هیچ كوفر و شركێكی لێ نەبنراوە ئەو كەسە هیچ حوكمێكی لەسەر نادەین لەبەر ئەوەی علمان پێ نییە و بەبێ عیلم ڕاست و دروست و حەڵاڵ و جائزنی یە حوكمی ئیسلامەتی یان كافرێتی بدەین بەسەر كەسێكدا كە هیچ نیشانەیەكمان لێ نەبینیوە كە ببێتە بەڵگە بۆ حوكمدان لەسەری,

ئیمامی بخاري رحمە اللە لە صحیحەكەی خۆی دا بابێكی هێناوە بەناوی (( باب العلم قبل القول والعمل )) واتە عیلم و زانست لە پێش  وتە و كردوەوە, واتە نابێت بەبێ بوونی عیلم و زانست هیچ بڵێین و هیچ كارێ بكەین.

وە ئەم ئیمامە بەڕێزە بەڵگەی لە قوڕئانی پیرۆز هێناوەتەوە بۆ ڕاستێتی ئەو بابەی كە دایناوە و دەفەرموێت و الدلیل قولە تعالی (( فاعلم انە لا الە الا اللە واستغفر لذنبك ))سورة محمد

واتە: بزانە كە بەڕاستی هیچ  پەرستراوێك نییە كە حەقی پەرستنی هەبێت بێجگە لە اللە تعالی.

وە دە فەرموێت : ((فبدأ بالعلم قبل القول والعمل )) واتە اللە تعالی فەرمانی كردوە لە و ئایەتە پیرۆزەدا بە عیلم لە پێش وتەو كردوەوەدا.

كەواتە حوكمی كەسێ كە نیشانە و عەلامەتی ئیسلامەتی و شرك و كوفری لێ نەبینراوە وەستان و ((توقف))ە لە حوكم لەسەری تاكو نیشانەی ئیسلامەتی لێدەبینین و هیچ شرك و كوفرێكی گەورەی لێ نابینین و ئەو كاتە دەڵێین ئەو كەسە موسڵمانە, یان ئەگەر شركی گەورە و كوفری گەورەی دیارمان لێ بینی و ئەوكاتە دەڵێین ئەو كەسە كافرە,

چونكە اللە تعالی حوكم دان بە ئیسلامەتی و یان كافرێتی پەیوەست كردوە بە كۆمەڵێك نیشانە و علاماتەوە و ڕاست و دروست و حەڵاڵ و جائز نی یە  بەبێ بوونی ئەو نیشانە و عەلامەتانە, نەحوكمی ئیسلامەتی و وە نەحوكمی كافرێتی بدەین بەسەر كەسدا, شێخ محمد بن ناصر رحمە اللە كە یەكێكە لە قوتابیە دیار و ناودارەكانی شیخ محمدی كوڕی عبدالوهاب دەفەرموێت: فإنا لا نكفرالناس بالعموم, كما أنا لا نكفر الیوم بالعموم, بالنقول: من كان من أهل الجاهلیة عاملاً بالإسلام, تاركاً للشرك, فهو مسلم, وأما من كان یعبد الاوثان, ومات علی ذلك قبل

ظهور هذا الدين، فهذا ظاهره الكفر، و إن كان يحتمل أنه لم تقم عليه الحجة الرسالية، لجهله و عدم من ينبهه، لأنا نحكم على الظاهر، وأما الحكم على الباطن فذلك الى الله، والله تعالى لايعذب احداً الا بعد إقامة الحجة عليه، كما قال تعالى : (( وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا )) الاسراء-15

وأما من مات منهم مجهول الحال، فهذا لا نتعرض له، ولا نحكم بكفره ولا بإسلامه، وليس ذلك مما كلفنا به، ((تلك أمة قد خلت لها ما كسبت و لكم ماكسبتم ولا تسئلون عما كانوا يعملون )) البقرة 134 فتاوى الأئمة النجدية ج3 ص 97 و الدرر السنية ج10 ص 136.

واتە شێخ محمد بن ناصر دەڵێت: بەڕاستی ئێمە خەڵکی بەگشتی و عموم تەکفیر ناکەین، وەکو چۆن بەڕاستی ئێمە ئەمڕۆ تەکفیر ناکەین بەگشتی و عموم، بەڵکو دەڵێین: هەرکەسێ لە ئەهلی جاهیلیەت کاری بە ئیسلام کردو تەرکی شیرکی کردبوو، ئەوە ئەو موسڵمانە، بەڵام ئەوەی کە پەرستنی بۆ بتەکان دەکرد، وە مرد لەسەری ئەوە پێش دەرکەوتن و ظهوری ئەم دینە - پێش دەرکەوتنی دەعوەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب – هەچەند ئەو کەسە لەوە دەچێت ئیقامە حوجەی رسالەی لەسەر نەکرابێت، لەبەر نەزانین و جەهلەکەی، وە لەبەر نەبوونی کەسێك ئاگاداری بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئێمە بەڕاستی حوکم دەکەین لەسەر ظاهر، بەڵام حوکم لەسەرباطن و ناوەوە ئەو بۆ لای الله تعالى يە، و الله تعالى سزا و تعزیبی کەسێك نادات ئیلا دوای ئیقامە حوجە لەسەری، وەکو ئەوەی الله تعالى دەفەرموێت: ئێمە تەعذیب دەر و سزا دەرنین هەتا ڕەوانی دەکەین پێغەمبەر .الاسراء 15 , وە بەڵام ئەوەی مردبێت لە ئەوان بە مجهول الحال ئەوە کارمان پێوە نییە وە نە حوکمی کوفری وە نە حوکمی موسڵمانی نادەین، وە بە پێ دانی ئەو حوکمە تەکلیف و داوامان لێ نەکراوە (ئەوان ئومەتێك بوون لە پێش ئێوەدا، ئەوان کردەوەی خۆیان هەیە و ئێوەش کردەوەی خۆتان هەیە، خۆ ئینتسابکردنی ئێوە بۆ ئەوان بەبێ بوونی کردەوەتان سودی بۆتان نابێت).

بڕوانە چۆن ئەم شێخە خەڵکی پێش دەرکەوتنی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب و دەعوە و بانگەوازە پیرۆزەکەی پۆلێن دەکات و بەپێ ی ظاهریان لە یەکیان جیادەکاتەوە و هەرکەسێکیان کاری بە ئیسلام کردبێت و شیرکی تەرك کردبێت بە موسڵمانی زانیوە و هەرکەسیش شرکی گەورەی ئەنجام دابێت و پەرستنی بە ناحەق و ناڕەوا کردبێت بۆ بتەکان بە کافری زانیوە و وتویەتی لەبەرئەوە ئێمەی ئەهلی سوننەت حوکم بە ظاهر دەکەین، هەچەند ئەوکەسەی شرکی کردوە و مردوە ئەگەرو ئیحتمالی ئەوە هەیە جەهلی بوبێ و کەس نەبوبێت ئاگاداری بکاتەوە لە شرکەکەی، بەڵام وەك حوکم بە ظاهر دەکرێت هەرکەس شرك بکات بەجەهلەوە بێت یان بەعیلمەوە ئەوە ئەوکەسە مشرکە بەڵام لەقیامەتدا الله تعالى سزا و تعذیبی ئەو مشرکانە دەدات کە ئیقامە حوجەی رسالی کراون،

بەڵام ئەوانەی حاڵیان دیار نەبووە و مەجهول بووە دەڵێت ئەوانە کارمان پێیانەوە نی یە و نە حوکمی کوفر و نەحوکمی ئیسلامیان نادەین.

**تێبینی:** لەوە دەچێت بڵێن شێخ احمد بن ناصر مەبەستی لە مجهول الحال لە وتەکەیدا ئەو کەسانەبێت کە لە دنیادا شرکی گەورەیان ئەنجامداوە و حاڵیان دیار نەبوە کە ئایا ئیقامە حوجەی رسالی کراون یان نا کەدەڵێت نەحوکمی کوفر و نەحوکمە ئیسلامیان نادەین, ئەوە لە وێدا مەبەستی ئەوەیە بە موشریکیان دەزانێت و بەڵام زانایانی نەجد و شێخ الاسلام ابن تیمیە کەسێك شرکی گەورە بکات پێ ی دەڵێن مشرك وە بە موسڵمانی نازانین و بەڵام پێ ی ناڵێین کافر تاکو اقامة حجەی رسالی لەسەر دەکرێت, کەواتە شێخ محمد بن ناصر توقفی نەکردوە لەسەر ئەو مجهول الحالانە و بەڵکو بە موشرکیانی زانیوە بەڵام بۆ باسی تعذیب و سزا دانی قیامەتیان لە سەر ئەوباسە, لەوەڵام دا دەڵێن بەڵێ شێخ الاسلام ابن تیمیە و زانایانی نەجد حوکمی کەسێك کە شرکی ئەنجام دابێت بەوە داوە کە مشرکە و موسڵمان نی یە بەڵام ئەگەرئیقامە حجەی رسالی نەکرابێت پێیان نەوتوە کافر, بەڵام لەوتەکەی شیخ محمد بن ناصر دا ئەوەی لەم تێبینیەدا باس کرا شیخ لەپۆلێنەکەیدا بۆ ئەو خەڵکە ئەوەی لە بەشی دووەمی پۆلێنەکەیدا باس کردوە و ئاماژەی پێکردوە و باسی ئەوەی کەسێك ئەگەر شرکی ئەنجامدا موشریکە حوکمی ظاهری ئەوەیە هەرچەند ئەگەری ئەوە هەیە ئەو کەسە ئیقامە حوجە نەکرابێت ئەوە ئەوکەسە لە دنیادا بەپێ ی ظاهر موشریکە و لە قیامەتدا جەهلەکەی دەبێتە عوذر بۆی سزا و تعذیب نادرێت تاکو لە ساحەی عەرەساتدا تاقی دەکرێتەوە , کەواتە چۆری سێیەم لە پۆلێنی شێخ محمد بن ناصر دا باسی ئەو مجهول الحال ە یە کە نە ئیسلام و نە شرك و کوفری گەورەیان لێ بینراوە و هەر بەو کوفر و نە بە ئیسلام حوکمیان لەسەر نادرێ, وە ئەوەش کە زیاتر ڕاستێتی ئەوەی کە وتمان دەسەلمێنێ لە لێکدانەوەمان لە وتەکەی شێخ محمد بن ناصر, ئەوەیە کە خاوەنی کتابی(( فتاوی الأئمة النجدية))یە و پێش ئەوەی وتەکەی محمد بن ناصر بهێنینەوە لە بارەی مجهول الحال هوە دەڵێت: هەرکەس لەوان مردبێت ب مجهول الحال ی (( شیخ محمدی کوڕی عبدالوهاب و نەوەکانی )) حوکمیانیان نەداوە بە ئیسلام لەبەر ئەوەی بنچینەو ئەصلێکیان لە لانەبوە بۆ حوکم دان پێ ی لەسەر قەومەکەیان (( واتە وەکو دارالإسلام نەبووە تاکو بڵێن ئەصل لە خەڵکدا ئیسلامە و کەواتە مجهول حال حوکمی ئیسلامە, وە وەك دارالکفری ئەصلیش نەبوە تاکو بڵێن ئەصل لە خەڵکدا کوفرە وە مجهول الحال کافرە, بەڵکو لە دارەکەی ئەواندا کە دار الکفری طارىء بوە توقف یان کردوە )), وەهەروەها حوکمیان نەداوە بە کوفری , لەبەر ئەوەی ئەوان بیر و باوەڕو عەقیدەیان وابووە کە الله تعالى داوا و تەکلیفی ئەوەیانی لێ نەکردوە . فتاوى الائمة النجدية 93

## 13- خەواریجەکان کێن و دەڵێن چی ١

خەواریجە گومڕاکان هەرلەسەرەتای دەرکەوتن و پەیدابونیاننەوە لەسەردەمی پێغەمبەری بەڕێز و خۆشەویستمانەوە صلی الله علیه وسلم کە لەو کاتەدا کە لەوکاتەدا بە شێوەی تاك دەرکەوتن و پاشان لەسەردەمی هەردوو خەلیفەی ڕاشدی بەڕێزدا ئیمامی عثمان و ئیمامی علي -الله لێیان ڕازیبێت- کە سانێك بون لە دیارترین سیفەتەکانیان جەهل و نەزانین بووە، دیارترین بەڵگەش ئەوان لەکاتێکدا بەشێوەی کۆمەڵ پەیدابوون و سەریانهەڵدا کە هەزاران هاوەڵی بەڕێزی رسول الله "صلی الله علیه وسلم" لە ژیاندا بوون, بەڵام سوپاس و حەمد بۆ الله تعالی کە کە خەواریجە گومڕاکان تەنها یەك هاوەڵی بەڕێزیان لەگەڵ دانەبوون هەروەکو نووسەرانی مێژوو لە کتێبەکانیاندا ئەم ڕاستیەیان باسکردوە و نووسیویانەتەوە.

نەبوونی هیچ هاوەڵێك لەگەڵ خەواریجەکاندا بەڵگەیە لەسەر گومڕایی و نەزانین و جەهلی زۆری خەواریجەکان, چونکە عیلم و زانستی قورئان و سوننەت لە لای هاوەڵە بەڕێزەکان بوو کە لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە "صلی الله علیه وسلم" وەریان گرتبوو.

ئەم سیفەتی جەهل و نەزانینە لە ناو خەواریجەکاندا لە هەموو سەردەم و جێگایەکدا لە دیارترین سیفەتەکانی ئەو کۆمەڵە گومڕا و سەر لێشێواوەیە کە هەر لە ئەو سیفەتی نەزانین و جەهلەیانەوە بەناحەق و ناڕەوا دەست دەکەن بە تەکفیر کردنی ناڕەوا و ناحەق موسڵمان بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەکی شەرعی.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

**براتان/ السني الكردي**